زنجیرەی گەنجینەی گەوهەر

(٢)

# ٦٠ پرسیار دەربارەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ


ئامادەکردنی

عبدالرحمن نجم الدین طه



چاپی دووەم

١٤٢١ ك - ٢٠٠٠ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

# پرسیارەکان

١/ (هاشم) ی باپیرە گەورەی پێغەمبەر ﷺ دوو ئیشی گەورەی لەئەستۆدا بوو ، ئەو ئیشانە چی بوون ؟

٢/ کێ سەر لە نوێ بیری (زەمزەم) ی دۆزیەوەو هەڵیدایەوە ؟

٣/ بۆچی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (من کوڕی دووکەسە سەربڕاوەکەم) ؟

٤/ ئەو کەسە کێ بوو کە پەنای پێغەمبەری خوای دا ، پاش گەڕانەوەو نائومێد بوون لە خەڵکی طائف ؟

٥/ یەکەم مزگەوت کە لە مەدینەدا دروست کرا ، رووەو کوێ بوو ؟

٦/ ناوی پێنج پشتی پێغەمبەری نازیز ﷺ بڵێ ؟

٧/ (عبدالموتەلیب) ی باپیری پێغەمبەر ﷺ چەند کوڕی هەبوو ؟

٨/ لە جەنگی (بەدری گەورە) دا ، چەند کەس لە بێ باوەڕان کوژران ، ناوی دوان لەسەرانیان چی بوو ؟

٩/ ئەو شەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە ، کێ لە شوێنەکەیدا خەوت ؟

١٠/ ئەو سێ کەسە ئیماندارەی لە جەنگی (تەبوک) دا خۆیان دواخست ، کێ بوون ؟

١١/ یەکەمین ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شەهید بوو ، کێ بوو ؟

١٢/ دەورو بەرو ناوی کەعبەی پیرۆز چەند بتی تیا بوو ؟

# وەلامەکان

و١/ یەکەم : (الرفادة) : نان دان بە حاجی‌یەکان .
دووەم : (السقایة) : ئاودان بە حاجی‌یەکان .
و٢/ (عبدالموتەلیب) ی باپیری پێغەمبەر .
و٣/ چونکە لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەرەو ، کوڕی (عبدالله)یە ، کە هەردووکیان کراون بە قوربانی ، بەلاّم لە ئەنجامدا لەبری ئیسماعیل بە رانێک و ، لە بری عبدالله سەد حوشتر کرا بە قوربانی .
و٤/ (موتعەمی کوڕی عودەی) .
و٥/ روەو (بیت المقدس) بوو لە فەلەستین .
و٦/ محمد ، کوڕی عبدالموتەلیب ، کوڕی هاشم ، کوڕی عبدالمناف ، کوڕی قصی .
و٧/ (دە) کوڕی هەبوو ؟
و٨/ (حەفتا) کەسیان لی کوژرا .. ئەبو جەهل ، ئومەییەی کوڕی خەلەف .
و٩/ حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ـ خوای لی ڕازی بێت .
و١٠/ کەعبی کوڕی مالیک ، مەرارەی کوڕی رەبیع ، هیلالی کوڕی ئومەییە ـ خوایان لی رازی بێت .
و١١/ خاتو سومەییە ـ خوای لی رازی بێت .
و١٢/ (سێ سەدو شەست) بت .

١٣/ لە جەنگی (تەبوک) دا ژمارەی لەشکری موسڵمانان چەند بوو
١٤/ پێغەمبەری خوا ﷺ چەند رۆژ نەخۆش بوو ،وە لەچ کاتێکدا وەفاتی کرد ؟
١٥/ پێغەمبەر ﷺ لەکام مانگدا لە دایک بوو ، وە لەکام مانگدا وەفاتی کرد ؟
١٦/ مۆری پێغەمبەرایەتی لە کوێی لاشەی پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو ؟
١٧/ هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ سەرەتا بەچی دەستی پێ کرد ؟
١٨/ قۆناغی بانگەوازی نهێنی لە (مەککە) دا چەندی خایاند ؟
١٩/ بۆچی پێغەمبەر ﷺساڵی (١٠) یەمی پێغەمبەرایەتی ناونا (ساڵی ماتەمینی) ؟
٢٠/ گەمارۆی هەمەلایەنە لە (کێوی ابو تالیب) دا چەند ساڵی خایاند؟
٢١/ لە بەیعەی (عەقەبە) ی دووەمدا ، پێغەمبەر ﷺ چەند کەسی هەڵبژاردو ، چ ناوێکی لێ نان ؟
٢٢/ لەکاتی کۆچ بۆ مەدینە ، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا چوونە ناو کام ئەشکەوت و ، چەندە تیایدا مانەوە ؟
٢٣/ ئەو قسە مەشهورەی (عبدالمطلب) بە ئەبرەهەی وت ، چی بوو ؟
٢٤/ یەکەم مزگەوت کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دروستی کرد ، ناوی چی بوو ؟

و١٣/ (٣٠) سی هەزار کەس .

و١٤/ چوارده رۆژ نەخۆش بوو ، لە چێشتەنگاوێکی درەنگی رۆژی دووشەممەدا وەفاتی کرد .

و١٥/ لە مانگی (ربیع الاول) دا لە دایکبووە ، هەروەها لە مانگی (ربیع الاول) یشدا وەفاتی کردوە .

و١٦/ لەنێو شانی پیرۆزیدا .. هێندەی هێلکە کۆترێک بووە .

و١٧/ بە بینینی خەوی راست ، هەر خەوێکی بدیبایە رێک دەهاتە دی.

و١٨/ ماوەی (سێ) ساڵ بەردەوام بوو .

و١٩/ چونکە (خاتو خەدیجە) ی خێزانی و (ئەبو تالیبی) مامی لەو ساڵەدا کۆچی دواییان کرد .

و٢٠/ سێ ساڵی رەبەق ، لە مانگی (محرم) ی ساڵی (٧) تا مانگی (محرم) ی ساڵی (١٠) ی پێغەمبەرایەتی .

و٢١/ دوانزە کەس ، ناوی نان (نەقیب) .

و٢٢/ ئەشکەوتی (ثور) ، سێ شەو تیایدا مانەوە .

و٢٣/ (إن للبيت ربا سيحميه) ... واتە کەعبە خواو خاوەنی خۆی هەیە ، ئەو دەیپارێزێت .

و٢٤/ مزگەوتی (قباء) .

٢٥/ دایەنەکەی پێغەمبەر ﷺ ناوی چی بوو ، وەلە کام هۆز بوو ؟
٢٦/ مەدینە سێ هۆزی بەناوبانگی جولەکەی تیا بوو ، ناوی ئەو هۆزانە چی بوو ؟
٢٧/ یەکەم : پیاو ، ئافرەت ، منداڵ ، کە موسڵمان بوون کێ بوون ؟
٢٨/ یەکەم کۆچ بۆ ئیسلام کرا ، بەرەو کوێ ؟ وەچەند کەس بوون ؟
٢٩/ لەکاتێ گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە (طائف) ، لە (وادی النخلة) دا روداوێکی گەورە رووی دا ، چی بوو ؟
٣٠/ بەشدارانی خەڵکی مەدینە لە پەیمانی عەقەبەی یەکەمدا ، چەند کەس بوون ؟
٣١/ ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ ناوی چی بوو کە بە هۆی خواردنی گۆشتە ژەهراوییەکەوە لە خەیبەردا شەهید بوو ؟
٣٢/ یەکەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ کەلەدوای وەفاتی خاتوو خەدیجە خواستی ، کێ بوو ؟
٣٣/ لەماڵی کێدا پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان (انصار) و (مهاجرین) ، چەند کەس ئامادە بوون ؟
٣٤/ ئەندازەی ئەشکەوتی (حەراء) چەندە ؟
٣٥/ کام هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ خەوی بینی بە شێوازی بانگدانەوە ؟
٣٦/ ئەو شیعرە کامەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی هەڵکەندنی (خەندەق) دا دەیفەرموو ؟

و ۲٥ / (خاتو حەلیمە) ی کچی (ابو ذویب) ... لەهۆزی (بەنی سەعد) .
و۲٦ / بنو قینقاع / بنو نضیر / بنو قریظة .
و۲۷ / پیاو : حەزرەتی ئەبو بکر ی صدیق ، ئافرەت : خاتو خەدیجە ، مندالّ حەزرەتی عەلی ـ خوایان لیّ رازی بیّت .
و۲۸ / کۆچی جاری یەکەم بوو بەرەو (حەبەشە) ... دوانزە پیاو وچوار ئافرەت بوون .
و۲۹ / کۆمەلیّک (جن) بە بیستنی قورئان سەرسام بوون و ، ئیمانیان هیّنا بە پیّغەمبەر ﷺ .
و ۳۰ / پیّنج کەس لە هۆزی (خەزرەج) و ، دوو کەس لە هۆزی (ئەوس) .
و ۳۱ / (بیشری کوڕی مالیک) ـ خوای لیّ رازی بیّت .
و ۳۲ / خاتو سەودەی کچی زەمعەبوو ـ خوای لیّ ڕازی بیّت .
و ۳۳ / لەمالّی ( ئەنەسی کوڕی مالیک) ـ خوای لیّ رازی بیّت ـ (نەوەد) کەس ئامادە بوون ، نیوەیان (انصار) و نیوەشیان (مهاجر) بوون .
و ۳٤ / دریّژیەکەی ٤ قولّ ، پانیەکەشی ( ۱.۷٥ ) قۆلّ (ذراع) .
و ۳٥ / عبداللەی کوڕی زەید خوای لیّ رازی بیّت .
و۳٦ / دەیفەرموو : اللهم لاعیش الا عیش الأخرة فاغفر للانصار والمهاجرة

٣٧/ هۆی هەڵگیرسانی جەنگی (مؤتة) چی بوو ؟

٣٨/ پێغەمبەر ﷺ دوای دەرچوون لە مەدینە بۆ گرتنی کاروانەکەی ابو سفیان و ، پێش دەست پێکردنی جەنگی (بەدر) ، دوو کەسی نارد هەواڵی کاروانەکە بزانن ، ئەو کەسانە کێ بوون ؟

٣٩/ پێغەمبەر کە خاتوو خەدیجەی خواست ، تەمەنیان چەند بوو ؟

٤٠/ ئەو کەنیزەکەی بۆ یەکەمین جار ـ لەدوای دایکی خۆی شیری دا بە پێغەمبەر ﷺ کێ بوو ؟

٤١/ کە کەعبە بەهۆی لافاوەوە ڕوخا ، ئەو وەستا بەنایە ناوی چی بوو ا کەسەرلەنوێ بە فەرمانی عەرەبەکان دروستی کردەوە ؟

٤٢/ پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا بەشداری کام پەیمانی کرد ؟

٤٣/ کوڕەکانی پێغەمبەر ﷺ ناویان چی بوو ؟

٤٤/ ناوی کچەکانی پێغەمبەر ﷺ چی بوو ؟

٤٥/ لەگەشتی (الاسراء والمعراج) دا کام فریشتە هاوەڵی پێغەمبەر بوو ؟

٤٦/ کام لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بە دایکی هەژاران ناسراوە ؟

٤٧/ یەکەمین (سریە) کە پێغەمبەر ﷺ بەڕێی خست بە فەرماندەیی کێ و ، چەند کەس بوون ؟

٤٨/ ژمارەی لەشکری موسڵمانان و لەشکری بێ باوەڕان لە جەنگی بەدر دا چەند بوون ؟

و٣٧/ کاربەدەستێکی قەیسەری پاشای ڕۆم لە ناوچەی (بەلقاء) نامەبەرێکی پێغەمبەری شەهید کرد .
و٣٨/ (بەسبەسی کوڕی عامر) و (عودەی کوڕی ئەبو زەغباء) خوایان لێ ڕازی بێت .
و٣٩/ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی بیست و پێنج ساڵ و ، خاتوو خەدیجەش چل ساڵ بوو .
و٤٠/ ناوی (سوەیبە) ـ بوو ، کەنیزەکی (ئەبو لەهەب)ی مامی پێغەمبەر بوو .
و٤١/ وەستا (باقوم) ی ڕۆمی .
و٤٢/ پەیمانی (حلف الفضول) .. کە بە مەبەستی یارمەتیدان و پشتگیریی لە ستەم لێکراوان بەسترا .
و٤٣/ سێ کوڕ : (قاسم ، عبدالله ، ابراهیم) .
و٤٤/ چوار کچ : (زینب، رقیة ، ام کلثوم ، فاطمة) .
و٤٥/ حەزرەتی (جوبرەئیل) ـ سەلامی خوای لێ بێت .
و٤٦/ خاتوو ( زەینەبی کچی خوزەیمە) ـ خوای لێ ڕازی بێت .
و٤٧/ سریەی (سیف البحر) ، بە فرماندەیی حەزرەتی حەمزە ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ ، (٣٠) کەس بوون .
و٤٨/ لەشکری ئیسلام (٣١٤) کەس .. لەشکری بێ باوەڕان (هەزار) کەس .

٤٩ / ئەو هاوەڵە بەرێزە کێ بوو ، لە جەنگی (ئوحود) دا کە شەهید کرا ، فریشتەکان شۆردیان ؟
٥٠ / چەند جارو لەکوێ سنگی پێغەمبەر ﷺ لەت کراوە ؟
٥١ / لەساڵی (٧ کۆچی) دا ، پێغەمبەر ﷺ نامەی نارد بۆ چەند پاشاو ئەمیرێک و بانگی کردن بۆ ئیسلام .. کێ بوون ؟
٥٢ / بۆ کام جەنگە بوو ، پێغەمبەر ﷺ سێ کەسی دیاری کرد بەتەرتیب فەرماندەیی بکەن ، ئەگەر هەرکامیان شەهید بوون ، فەرماندەکان کێ بوون ؟
٥٣ / ئەو ژنە ناوی چی بوو ، کە لە (خەیبەر) دا حەیوانێکی ژەهراوی کرد بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر ؟
٥٤ / پێغەمبەر ﷺ گۆچانێکی بەخشی بە هاوەڵێکی ، ئەویش وەسیەتی کرد گۆچانەکە بخەنە ناو کفنەکەی ا ... ئەو هاوەڵە کێ بوو ؟
٥٥ / پێغەمبەر ﷺ کێی نارد بۆ شکاندنی بتی (عوززا) ؟
٥٦ / کام وشانە لە (پەیمانی دابڕین) دا مۆریانە نەیخواردبوون ؟
٥٧ / ئەو دووڕوو (منافق) ە کێ بوو کە بە سەرۆکی دووڕوەکان دەناسرا ، بەڵام کوڕەکەی هاوەڵێکی بەرێزی پێغەمبەر بوو ؟
٥٨ / یەکەمین جەژنی موسڵمانان لە چ ساڵێکدا بوو ؟
٥٩ / کەی قیبلە گۆڕرا لە (بیت المقدس) ەوە بۆ (کەعبەی پیرۆز) ؟
٦٠ / کام لە منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ وەفاتیان کردووە ، وەکامیان کەوتە دوای خۆی ؟

و٤٩ / (حه نظه له) ـ خوای لیّ رازی بیّت .
و٥٠ / دووجار : یەکەم : بە مندالی لای دایەنەکەی ، دووەم : لە شەوی (میعراج) .
و٥١ / نەجاشی پاشای حەبەشە / موقەوقەسی پاشای میسر / کیسرای پاشای فارس / جەیفەری پاشای عوملن / مونذیری کاربەدەستی بەحرەین / هوذەی کاربەدەستی یەمامە / حاریسی غەسانی کاربەدەستی دیمەشق .
و٥٢ / جەنگی(مؤتة) .. فەرماندەکانیش : زەیدی کوڕی حاریثەـ جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ـ عەبدوڵلای کوڕی رەواحە ـ خوایان لیّ رازی بیّت .
و٥٣ / زەینەبی کچی حاریث .
و٥٤ / عبدوڵلای کوڕی ئەنیس ، خوای لیّ رازی بیّت .
٥٥ / حەزرەتی خالیدی کوڕی وەلید ، خوای لیّ رازی بیّت .
و٥٦ / وشەی (بسمك اللهم) ، وەهەموو ناویّکی پیرۆزی (الله) !
و٥٧ / عبدوڵلای کوڕی ئوبەی بوو .. کوڕەکەی حەزرەتی (عبدوڵلا) بوو ـ خوای لیّ رازی بیّت .
و٥٨ / یەکەمین جەژن : جەژنی رەمەزانی سالی (٢) ی کۆچی بوو ، کە هاوکات بوو لەگەلّ جەژنی سەرکەوتن لە جەنگی (بەدر) دا .
و٥٩ / مانگی شەعبانی سالی دووەمی کۆچی .
و٦٠ / هەموو مندالەکانی پیّغەمبەر ﷺ پیّش خۆی وەفاتیان کرد ، بەلاّم حەزرەتی فاتیمە (شەش مانگ) دوای خۆی وەفاتی کرد .
سەرچاوە ، الرحيق المختوم: المبارك فوري / فقه السيرة : محمد الغزالي / السيره النبوية : ابن هشام

## براو خوشکی خوێنەری بەرێز..

(زنجیرەی گەنجینەی گەوهەر)، کۆمەڵێك زانیاری پێویست و گرنگ و بەسوودی لە خۆگرتووە، ئەم ئەڵقانەی لای خوارەوەی لێ بڵاوبووەتەوە:

١- (٧٥) پرسیار دەربارەی قورئانی پیرۆز.

٢- (٦٠) پرسیار دەربارەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ.

٣- (٧٥) پرسیار دەربارەی ژیانی پێغەمبەران.

٤- (٦٥) پرسیار دەربارەی رەمەزانی پیرۆز.

٥- (٨٠) پرسیار دەربارەی جێنشینەکانی پێغەمبەر.

٦- (١٠٠) پرسیار دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر.

٧- (٧٠) پرسیار دەربارەی رۆژی قیامەت ، بەهەشت ، دۆزەخ.

٨- (١٠٠) پرسیار دەربارەی مێژووی شارستانیەتی ئیسلامیی.

٩- (١٠٠) پرسیار دەربارەی زانایانی ناوداری ئیسلام.

١٠- (٧٠) پرسیار دەربارەی ئافرەتانی موسڵمانی ناودار.

ژمارەی سپاردنی ئەڵقەکانی ئەم زنجیرە (٢٤٥) بۆ ساڵی ١٩٩٨ ز